# تەفسیری نامی

## بۆ قورئانی پیرۆز

١

دانراوی: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس

ئامادەکردنی: موحەممەد عەلی قەرەداغی

سەرپەرشتی چاپی نوێ: ڕەئووف مەحموودی

| | | |
|---|---|---|
| سرشناسه | : | مدرس، عبدالكريم، ۱۹۰۵ - ۲۰۰۵م. Mudarris, Abd al - karim |
| عنوان و نام پدیدآور | : | دەقی تەفسیری نامی/دانراوی عبدالكریمی مودەرریس. |
| مشخصات نشر | : | سنندج: انتشارات کردستان، ۱۳۸۹. |
| مشخصات ظاهری | : | ۶ ج. |
| شابک | : | دوره: 9649800363؛ ج.۱: 9649800370؛ ج.۲: 9649800387؛ ج.۳: 9649800394؛ ج.۴: 9649800400؛ ج.۵: 9649800417؛ ج.۶: 9649800424؛ |
| وضعیت فهرست نویسی | : | فیپا |
| یادداشت | : | کردی. |
| عنوان دیگر | : | تەفسیری نامی بوقورئانی پیروز. |
| موضوع | : | تفاسیر اهل سنت -- قرن ۱۴ق. |
| رده بندی کنگره | : | ۱۳۸۶ ۹ت۳۸م/BP۹۸ |
| رده بندی دیویی | : | ۱۷۹/۲۹۷ |
| شماره کتابشناسی ملی | : | ۷۳۵۶۱۱۱ |

# تەفسیری نامی

## بۆ قورئانی پیرۆز

نووسینی:

مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس

بەرگی یەکەم

(بەقەرە)

بڵاوکردنەوەی کوردستان

سنە

انتشارات کردستان
Kurdistan Publication

سنە ـ پاساژی عیززەتی ـ تەلەفوون ـ ۲۲۶۵۳۸۲

# تەفسیری نامی



| | |
|---|---|
| ✔ ناوی کتێب (نام کتاب): | تەفسیری نامی (بەرگی یەکەم) |
| ✔ دانراوی (تألیف): | مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس |
| ✔ کەرەتی چاپ (نوبت چاپ): | یەکەم (اول)؛ ۱۳۸۹ |
| ✔ ژمارەی چاپکراو (تیراژ): | ۳۰۰۰ دەورەی شەش بەرگی (دورەی شش جلدی) |
| ✔ ژمارەی لاپەڕەو قەوارە (تعداد صفحه و قطع): | ۵٦۰ صفحەی وزیری<br>(شش جلد ۳۳٦۰ صحفه) |
| ✔ بڵاوکەرەوە (ناشر): | بڵاوکردنەوەی کوردستان (انتشارات کردستان) |

| | |
|---|---|
| نرخی دەورەی شەش بەرگی:<br>٦۲,۰۰۰ تمەنە | شابک دورە: ۳ ـ ۰۳٦ ـ ۹۸۰ ـ ۹٦٤ ـ ۹۷۸<br>شابک ج ۱: ۰ ـ ۰۳۷ ـ ۹۸۰ ـ ۹٦٤ ـ ۹۷۸ |

## پێشەکی چاپی نوێ

**مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس**

مەلەوانی دەریای وشە و مەعانی، شۆڕەسواری گۆڕەپانی نوکتەزانی، خەڵوەکێشی حوجرەی وانە زانان، دەروون پڕ لە سۆزی "سەناو سکاڵا" بە بەیانان، زاهیدی سەر بەرماڵی تەکیە و خانەقا، لە فەنا گوزەشتوو و گەیشتوو بە هەوارگەی بەقا، شەمی بەشەرم و حەیا هەڵگیرساوی سەرتاقان، چرای ڕۆشنگەری ماڵان لە دەلاقان، "شەمامەی بێندار"ی نێو بێستانی هۆنەران، "وەنەوشەی نازدار"ی سەرچاوە و جۆباران، لە "باخچەی گوڵان"دا بولبولی هەزار ئەلحانە، لە دوانگەی "وتاری ئایینی"دا وتەبێژێکی خۆش‌خوانە، شیعری "شەوچەرەی دڵدار"ی نێو دیوەخانە، پەخشانی "لیمۆی مەزەدار"ی نێو باخانە، "ڕێگەی ڕەهبەر"ی بە "چلچرای ئیسلام" و "نووری قورئان" ڕووناك کردووە، سەنای ڕەهبەر و یارانی ڕەهبەری بە دڵ و دەروونی پاك کردووە، لە بازاڕی مەی‌فرۆشاندا پیاڵەی لە دەستی "ئالووسی" و "زەهاوی" سەندووە، لە بەزمی بادە نۆشاندا مەزەی "ئاوی حەیات"ی لە سینە سووتاوانی تەریقەت چەشتووە، قسەی بە پێز و وتەی بە هێزی لە "نالی" و "مەحوی" و "مەولەوی" بە خەڵات بردووە، "دوو ڕشتە"ی هزری بەرز و سۆزی سەد تەرزی لە ناسك خەیاڵان و

دەروون عەبدالاَن وەرگرتووە، "نامەی بۆندار" و "پیرۆز"ی بۆ "بەختیار"ی و "هۆشیار"ی گەلەکەی نووسی تا زاری تینوویان لە "سەرچاوەی ئایین" تێراو بکات، "شەریعەتی ئیسلام" و "تەفسیری نامی" دانا تا باخی بڕوایان پاراو بکات، تۆ بووی بە "بارانی رەحمەت" و جوامێرانە باریت بە سەرمانا، تا درختی ئیمان ریشەی بڕوا و چرۆی هیوا بروێنێ لە ناخمانا، خوای گەورە بەزەیی خۆی بە لێزمە و بە تاوی "بەهار" برژێنێتە سەر "گوڵزار"ی گوڵکۆی پیرۆزت، و "رێگەی بەهەشت"ت بۆ رووناك بکات بە "نوور و نەجات"ت بدا لە پەژارە و بتخاتە نێو شادی و سروور.

**کۆپلەیەك لە ژیانی مامۆستا**

ئەم زاتە لە هیچ یەك لە نووسراوەکانیدا بە راشکاوی شوێنی لە دایکبوونی خۆی نەنووسیوە، بەڵام هەندێ سەرچاوە جەخت لەسەر ئەوە ئەنێن کە لە کوردستانی رۆژهەڵات و لە دەڤەری شاری مەریوان لە دایك بووە[١]، جا بۆ ئەوەی کورتەیەك لە ژیانی ئەم زانا بلیمەتەمان بۆ روون ببێتەوە ئەچینە خزمەت کتێبە دەسنووسەکەی خۆی (رۆژگاری ژیان) و گوڵبژێرێکی ئاراستە ئەکەین.

ناوی عەبدولکەریمی[٢] کوڕی موحەممەدی کوڕی فەتتاحی کوڕی سلێمانی کوڕی موستەفای کوڕی موحەممەد خەجێ و لە هۆزی قازییە. فەتتاح (واتە: باپیری مامۆستا) لەگەڵ عەزیزی برایا و زەریفەی خوشکیا لە دەوروبەری ساڵی ١٨٥٨ زایینی چوونەتە دێی "تەکیە" سەر بە ناحیەی "خورماڵ"، کە موڵکی شێخ بەهائەددینی کوڕی شێخ عوسمانی "تەوێڵە" بووە، لەوێ بە عینوانی جووتیار بەسەر زەوی و زارەکەی شێخەوە ئیشی کردووە، خێزانیشی لەگەڵ بەخێوکردنی منداڵەکانی خۆی شیریشی داوە بە شێخ حیسامەددینی کوڕی شێخ بەهائەددین و مەحرەمییەتی شیری لە نێوانیاندا دروست بووە، لە ساڵی (١٨٧٨ ز) باوکی مامۆستا (واتە موحەممەد) لە "تەکیە" لە دایك ئەبێ و دوای چەند ساڵێ فەتتاح (باپیری مامۆستا) فەوت ئەکا و خێزانی شوو ئەکاتەوە بە عەزیزی هێوەری و پاش چەند ساڵێ ئەگوێزنەوە بۆ دێی

١. بۆ ئەم بابەتەش بڕوانە "رۆژگاری ژیان" وە هەروەها پەراوێزی کتێبی "سەدەیەك تەمەنی نوورین" لاپەڕەی ٢٣.

٢. وە دوو نازناوی سەرەکی هەیە، یەکەم: مودەڕڕیس یا مودەڕڕیسی بیارە، دووەم «نامی». کە ئەمەیان زیاتر نازناوی ئەدەبییەتی و زۆرتر لە کتێبە کوردییەکان و هۆنراوەکانیدا کەڵکی لێوەرگرتووە.

"ڕەشان" لەلای "پێنجوێن" و پاشان لەوێشەوە ئەگوێزنەوە بۆ دێی "بەیێڵە"ی سەر بە شاری مەریوان.

موحەممەد (باوکی مامۆستا) لەساڵی (١٨٩٧ ز) ژنێکی «خانم» ناوی لە عەشیرەتی "سوورەجۆیی" کە لە نزیکی "شانەدەری"دا دانیشتوون هێناوە. سەرەنجام لە بەهاری ساڵی (١٩٠٣ ز)دا چوار ساڵ دوای لە دایکبوونی ئامینەی خوشکی، مامۆستا پێی ناوەتە دنیاوە و ساڵێ دوای ئەو رابیعەی خوشکیشی لە دایك بووە، باوکی پیاوێکی خوێندەوار و ساڵح و خزمەتگوزاری ئەهلی عیلم و موریدی شێخ عەلائەددین و دۆست و موحیببی مامۆستا حاجی سەید حەسەنی "چۆڕ" بووە، لەسەر ڕەغبەتی بە ئەهلی عیلم لە چوار پێنج ساڵیدا مامۆستا وەبەر خوێندن ئەنێ و لە لای مامۆستا مەلا "عەبدولواحید" مەلای ئاوایی دەست بە خوێندنی قورئان دەکات، ژیری و بیرتیژی و زەکاوەتی مامۆستا هەر لە منداڵییەوە سەرنجی هەموانی ڕاکێشاوە، وەك خۆی ئەفەرموێ: «تا سوورەتی زومەڕم خوێند پاشان ئەوەندە بەرچاوم کرایەوە لەوەو ژوور گوێیان لێ‌گرتم». پاش خەتمی قورئان باوکی شادیانەی بۆ ئەنێ و مەراسیمی پلاوخۆرانی بۆ ئەگێڕێ. پاشان باوکی، مامۆستا و دوو خوشکەکەیی بە منداڵی بەجێ دێڵێ و ماڵاوایی لە دنیا دەکات، وەك مامۆستا ئەفەرموێ: «مەرحوومی باوکم لە پێش وەفاتیا بە چەند ڕۆژێ ڕۆیشت بۆ تەعزییەی یەکێ لە دۆستان، لەو سەرەوە کە هاتبۆوە بە عاساکەی[١] خەتێکی لە ژێر دارگوێزێکا کێشابوو، فەرموو بووی: ئەگەر من لەم ڕۆژانا مردم لە ژێر ئەم دارا لەسەر حاستی ئەم خەتە بمنێژن. ئەو ڕۆژە بۆ شەوەکەی وەسیەتی کرد بۆمان کە لە پاش خۆی تەرکی خوێندن نەکەم،

---

١. لەوانەیە دارێك بووبێ بە دەسیەوە وەك چۆن ڕێبوار بۆ یاریدەدانی لە ڕۆیشتنندا کەڵکی لێ‌وەرئەگرێ، چونکە باوکی لەوتەمەنەدا ئەوەندە پیر نەبووە تا عاسا هەڵگرێ.

بە هەر وەزعێ ببێ هەردەوام بکەم، دائیمەن عەلاقەمان بە شێخی "عەلائەددین"ەوە ببێ، هەروا قەراری دا کە کاغەز و قەڵەم و دەوات بۆ من بسێنێ و بنووسم نەکا خۆی بمرێ و پەکم بکەوێ. دایکم لەم قسانە زۆر زویر بوو بەڵام ئێمە فامی ئەوەمان نەبوو، بە خواستی خودا لەو رۆژانا پاش کڕینی کاغەز و قەڵەم بۆ من لە بەهاری ١٩٠٧ وەفاتی کرد. رحمه الله و طاب ثراه».

پاش وەفاتی باوکی لەسەر وەسیەتەکەی باوکی و بە کۆششی دایکی بەردەوام دەبێ لەسەر خوێندنەکەی و لە لای مەلا موحەممەدی کوڕی شێخ قادر کتێبە وردە کوردییەکان ـ وەك: ئیسماعیل‌نامە و سەنگتراش و... کە لەو سەردەمەدا بۆ چاوڕوونی منداڵان خوێنراون ـ دەخوێنێ، پاشان شێخ عەلائەددین ئەم مەلا موحەممەدە دەکاتە مودەڕڕیسی خۆی لە دێی "دوورۆ" و مامۆستاش ئەگوێزێتەوە بۆ دێی "بەیێڵە" و دواتر دەچێتە دێی "ئەسراوا" و پاشانیش دەڕواتە دێی "کانی‌سانان" و لەوێیشەوە دەگوێزێتەوە بۆ دێی "سەردۆش" و لە لای مەلا سلێمانی کوڕی فەقێ عوسمان تەسریفی زەنجانی تەواو دەکات و دەست بە خوێندنی عەواملی جورجانی دەکات، دوای ماوەیەك لەوێش دەگوێزێتەوە بۆ دێی "بالك" بۆ لای مەلا مەحموودی جوانڕۆیی لەوێ کتێبی عەوامل و سەعدوڵڵای بچووك ئەخوێنێ، پاشان کە مەلا عەبدولواحیدی کوڕی مەلا عەبدوسسەمەد ئەبێ بە مەلای "گوێزەکوێرە" لە بەر دۆستایەتی قەدیمی دەچێتە گوێزەکوێرە[1] و لەوێ کتێبەکانی «ئونموزەج» تا باسی فیعل و «ئیزهار» و «تەسریفی مەلاعەلی» و دوو نامیلکەی «وەزع و ئیستیعارە» و هەندێك لە «جامی»

---

١. خوێندنی مامۆستا لەم هەموو دێیەی دەوروبەری شاری مەریوان ئەوەمان بۆ روون ئەکاتەوە کە مامۆستا لە دەڤەری ئەم شارەدا لە دایکبووە، وە بەم رۆیشتنی دواییەی بۆ دێی گوێزەکوێرەش ئەو بیرە کە دەڵێن لەم دێیە لە دایك بووە بێ‌هێز ئەکات.

ئەخوێنێ، لەم ماوەدا (واتە: لە ساڵی ١٩١٥) دایکی ـ کە تەنیا پاڵپشت و خەمخۆری ئەبێ ـ ماڵاوایی لە دنیا ئەکات و جارێکی‌تر نازی ماموستا دەشێوێ، بەڵام وەسیەتی باوك و دوعای دایك و ورەی پۆڵایینی ماموستا دەبنە هۆی پشت گەرمی بۆی و هیچ شتێك ناتوانێت ببێتە لەمپەر لە درێژە نەدان بە خوێندنی.

دوای ئاسایی بوونەوەی بارودۆخی دەروونی، هەردوو خۆشکەکەی دەباتە لای پووری (خوشکی دایکی) و خۆی ئەچێتەوە بۆ "کانی‌سانان" بۆ لای مەلا شەریف و درێژە بە خوێندنی کتێبی «جامی» ئەدات و پاش ماوەیەك ئەگوێزێتەوە بۆ دێی "دەرەتفێ" لەوێ جامی تەواو ئەکات و دەست بە خوێندنی «سیووتی» ئەکات و پاشان دەچێتەوە بۆ دێی "گوێزەکوێرە"، بەڵام لەبەر گرانی و نەبوونی کە بە هۆی شەڕی جیهانی یەکەمەوە کە ئەم ناوچەیەی داگرتبوو، دڵی لە رۆژهەڵاتی کوردستان هەڵئەکەنرێ و لەگەڵ مەلا عەبدوللەتیفی بانەیی و مەلا حەسنی بالیکەدەری بەرەو شاری سلێمانێ ئەکەونە رێ، دوای تووشبوونی هەندێ دەردیسەری دەگەنە شاری سلێمانی و لە مزگەوتی «مەلا عەزیزی بالیکەدەری»دا دائەمزرێن، (ماموستا هەم لەلای مەلا عەزیز لەو مزگەوتەدا و هەم لەلای مەلا عەبدوللەتیف لە مزگەوتی شێخ موحەممەدی بەرزنجە کتێبی سیووتی بە شەرحی ئەبووتالبەوە ئەخوێنێ)، پاش پێنج شەش مانگێ لەبەر بێ‌رزقی بەهۆی بێ‌بارانی و ئاڵۆزی بارودۆخ لەبەر شەڕی جیهانی لەوێ هەڵئەکنرێن و دێ بە دێ ئەکەونە رێ بۆ پەیداکردنی حوجرەیەك بۆ خوێندن، بە "چنگیان" و "شوکی" و "بەرزنجە" و "موریاس" و "تەپەکەل" و "هەڵەبجە" و عەبابەیلێ" و "بەڵخە" و "تەوێڵە" تێئەپەڕن تا سەرەنجام روو ئەکەنەوە رۆژهەڵاتی کوردستان، بە بڕینی رێی دوور و شاخە بەرزەکانی «تەتە» و «کەمانجەڕ» ئەگەنە خانەقای شێخ عەلائەددین لە "دوورۆ" کە مودەڕیسی ئەو کاتەی «سەید

حوسەین تائیربوغەیی» ئەبێ، وە دوورڕۆ لەو کاتەدا پڕ بووە لە فەقێ و تەلەبە و لەوێ دائەمەزرێن، وەك خۆی ئەفەرموێ: «کە گەیشتینە ئەوێ تەماشامان کرد مەدرەسە پڕە لە تەلەبە هاتن بە دەممانەوە و ئیکرامیان گرتین، بە خزمەتی شێخ گەیشتین و زیارەتمان کرد، ئەویش بەخێر هاتنی لێ‌کردین، بە خزمەتی سەید حوسەینی مودەڕڕیس گەیشتین. بە کورتی ئەوەندە دڵمان خۆش بوو ئازاری سەفەرەکەمان نەما».

بەهەرحاڵ مامۆستا لە دوورڕۆ نیشتەجێ ئەبێ و ئەڕوا دوو خوشکەکەی لە ماڵی پووری دێنێتە لای خۆی و هەر لەوێ بە شوویان ئەدا. وە لە زستانی ئەو ساڵەدا (١٩١٦ و ١٩١٧ز) گرانی و قاتی روو ئەکاتە ئەو ناوچەیە و مامۆستا باسی سەخاوەت و دەهندەیی بێ‌وێنەی حەزرەتی شێخ لەم زستانەدا بە درێژی ئەکات. لەم ساڵەدا مەلا سەید موحەممەدی کوڕی سەید ئەمین گیزملی ئەبێتە مودەڕیسی دوورڕۆ و مامۆستا لەسەر خوێندنەکەی بەردەوام دەبێت و کتێبەکانی «ریسالەی ئادابی مەنزوومە» و «عیسامەددین» و «ئیستیعارە» و «رەشدییە» و «فەنناری» و «عەبدوڵڵا یەزدی» لە زانستی لۆژیك (منطق) و «گەلەنبەوی ئاداب» و «شەرح مەنهەج» و «تەشریحولئەفلاك» و «ریسالەی حسێبی فارسی» ئەخوێنێت.

مامۆستا لەم ماوەیەی کە لە دوورڕۆدا بووە لەگەڵ هەوڵ و تێکۆشانی زۆری بۆ کۆکردنەوەی عیلم و زانیاری، چەندین سەفەری کردووە و رووداوی سەیری بینیوە کە بوونەتە تەجرەبەو ئەزموونێکی کاریگەر لە ژیانی زانستیی مامۆستادا، یەکێ لەو رووداوانەی کە لێرەدا بۆ نموونە ئاماژەی پێدەکەین ئەمەیە کە جارێکیان لە دوورڕۆ بەڕێ ئەکەوێ بۆ دەرەتفێ بۆ کڕینی کتێبی «گەلەنبەوی شەرح»، لەو سەرەوە کە ئەگەڕێتەوە ئەبێتە میوانی موحەممەد ساڵح بەگی کوڕی فەتاح بەگ لە دێی «تەرخاناوا»ی

مەریوان کە زۆر رێزی مامۆستا ئەگرێ و سوێند ئەخوا لە مامۆستا کە ئەبێ سواری ئەسپەکەی ببێت خۆی بە پیادە لە پێشیەوە بڕوا وەکوو مامۆستا ئەفەرموێ: «زۆر حەولم دا چارم نەبوو، «بالفعل» لەگەڵیدا هاتمەوە تا ماڵەوە و شەو لەسەربانی حەمە سەعید بەگی برایا نوستم، لەبەرەبەیانا بەم دەنگە خەبەرم بووەوە یەکێ ئەیوت: (إن أول ما خلق الله نور) «مع العلم» کە چاوم کردەوە نە کەس دیاربوو نە بانگیش درابوو، ئەم رووداوە زۆر دڵی رووناك کردمەوە، وە بە حاڵی ئینشیراحەوە هەستام نوێژی سبەینێم کرد».

خولاسە، پاش ئەوەی کە شێخ عەلائەددین تەشریف ئەباتە بیارە و دوورِۆ بەجێدێڵێ مامۆستاش لە گەڵ سەید فەرەج عەربەتی برادەریا ئەکەونە رێ و ئەچنە بیارە، بەڵام لەو کاتەدا بە هۆی فەوتی مودەڕیسی بیارەوە (مەلا عەبدولقادر)، بیارە بێ فەقێ ئەبێت، مامۆستا و سەید فەرەج لەسەر پێشنیاری شێخ ئەچنە عەبابەیلێ و ماوەیەك لەوێ دائەنیشن، بەڵام بەهۆی باش نەبوونی بارودۆخی خوێندنیان ئەگەڕێنەوە بۆ رۆژهەڵاتی کوردستان و مامۆستا ئەچێتەوە بۆ دێی دوورِۆ و درێژە بە خوێندنەکەی ئەدات و پاش تەواو کردنی کتێبی «گەلەنبەوی بورهان» ئەگوێزێتەوە بۆ دێی "بالك" بۆ لای مامۆستا مەحموودی جوانرۆیی و کتێبی «فەرائیزی مەنزووم»ی شێخ مەعرووفی نۆدێ و هەندێك لە «شەرح عەقاید»ی تەفتازانی ئەخوێنێت، پاشان کە بیارە فەقێ و مەلا رووی تێئەکەن، مامۆستاش خولیای بیارە ئەکەوێتەوە سەری و ئەچێتە ئەوێ و لە خزمەتی مەلا ئەحمەدی رەشدا کتێبی «عەقیدەی مەرزییە»ی مەولەوی و هەندێك لە «موتەووەل» ئەخوێنێ، پاشان ئەچێتە سلێمانی و بە خزمەتی شێخ عومەر ئیبنولقەرەداغی لە خانەقای مەولانا خالید ئەگا و شێخ عومەر میهرەبانی زۆری لەگەڵ دەکا و بە فەقێی خۆی وەریئەگرێ، بۆ ماوەی سێ ساڵ لە خزمەتیدا

دەمێنێتەوە، لەم ماوەیەی کە لە خزمەتی شێخ عومەردا ئەبێ ئاسۆیەکی‌تر لە زانست لە بەرچاویدا دەکرێتەوە، و هاوکات خەریکی دەرس‌خوێندن و دەرس‌وتنەوە و نووسین و راڤەکردن دەبێت. وە چەندین کتێبی بەنرخی وەك: «موختەسەری تەفتازانی»، «أقصی الأماني»، «ریاضیات»، «رسالة الحساب»ی بەهائەددینی عامیلی، «اسطرلاب»، «ربعی مجیب»، «تقریب المرام شرح تهذیب الکلام»، «جمع الجوامع»، «تحفه» و «شەرحی لاری» ئەخوێنێت، خوێندنی ئەم هەموو کتێبە لە خزمەتی ئەم مامۆستا ناودارانەدا مامۆستای نامی ئەکاتە مەلایەکی نموونەی بە تەواو مانا مەلا، پاشان لە ساڵی (١٩٢٤ز) لە سەر دەستی شێخ عومەر ئیجازەی مەلایەتی وەرئەگرێ و ئەبێ بە مەلا و مودەڕیسی دێی «نێرگسەجاڕ»، پاش چوار ساڵ مانەوە لە دێی نێرگسەجاڕ شێخ عەلائەددین داوای لێ‌ئەکات کە ببێت بە مودەڕیسی «دوورڕۆ» و بە تەمایە مودەڕریسی دوورڕۆ بێنێتە بیارە، بەڵام مودەڕیسی دوورڕۆ لەبەر چەند هۆیەك بۆی رێك ناکەوێ بێتە بیارە، سەرەنجام مامۆستا لە مانگی موحەڕەمی ١٣٤٧ك ـ ١٩٢٨ز، دەبێتە مودەڕیسی خانەقا و مەدرەسەی بیارە و لە هەموو شوێنێکەوە فەقێ و تەلەبە رووی تێئەکەن و رەونەقێکی باش ئەدا بەو حوجرەو مەدرەسەیە، وە هۆی قەرەباڵغی ئەم مەدرەسەیەش چەند شتێك بووە وەك مامۆستا ئەفەرموێ:

«یەکەم: بیارە شوێنێکی موقەددەس و پیرۆز بوو خەڵك بە ئومێدی بەرەکەت و بەختیاری روویان ئەکردە ئەو شوێنە، بە تایبەتی کە مەحاسینی شەریفەی حەزرەت ﷺ چەند تاڵە مووی ریشی موبارەکی پێغەمبەر ﷺ لە بیارەدا حازر بوون.

**دووەم**: شێخی بیارە بە پەیڕەوی لە ئەسلافی خۆی زۆر رەغبەتی لە خزمەتکردنی تەلەبەدا هەبوو، بە چاوی حورمەت تەماشای ئەکردن.

**سێهەم**: لە لوتفی خواوە شۆرەتی کۆشش و سەعیی من لەگەڵ تەلەبەدا بە وڵاتەکەدا بڵاو بووبووەوە، بەراوردیان کرد کە فەقێ لەلای من زۆر ئیستیفادە ئەکات.

**چوارەم:** تەلەبەکان غاڵبەن مەنسووبی شێخی بیارە بوون، زۆر تالبی ئەوە بوون کە لە نزیکی شێخدا دانیشن، چاویان لە شێخەوە بێ.

**پێنجەم:** شوێنی بیارە زۆر شوێنێکی خۆش و ئاودار و باغدارە، بە تایبەتی بۆ هاوین و بەهار و چەن مانگێ لە پایز وەکوو بەهەشتی سەر عەرزە.

**شەشەم:** لەبەر ئەوە کە هەموو ئەسبابی گوزەرانی فەقێکان تەنیا لە ماڵی شێخەوە بوو، ئازاد بوون لە حەولدان بۆ گوزەرانی ژیانی خۆیان.

**حەوتەم:** بیارە بە نیسبەتی باقی شوێنەکانی کوردستانەوە زۆر شوێنێکی ئیجتیماعی بوو، هەمیشە گەلێ لە عولەما و ئودەبا و موتەسەوویفین و پیاوی مەشرەب بەرزی تیابوو.

جا مەعلوومە شوێنی وەها هەمیشە خەڵك تالبی ئەبێ»[1].

بەڵێ ماموٚستا لە تەمەنی ٢٥ ساڵیدا دەبێتە مودەڕیس و وانەبێژی ئەم مەدرەسە گەورەیە کە لەو سەردەمەدا گەورەترین و بڕوا پێکراوترین پێگە و مەڵبەندی زانستە ئایینیەکانی کوردستان بووە و تەواوی زانیارییە ئیسلامییەکانی بە چاکترین شێوە تیا وتراوەتەوە، وە لە زۆر شوێنی کوردستان تەنانەت نەتەوەکانی‌تری دراوسێی کوردستان وەك فارس و تورك و عەرەب  روویان تێکردووە و بەهرەی ئایینی و زانستییان بردووە.

ماموٚستا لە ماوەی ٢٣ ساڵ مانەوەی لە بیارەدا بەبێ ماندووبوون خەریکی وانەبێژی و نووسین بووە لەم ماوەیەدا دەیان ماموٚستای چاك و زانا لە سەردەستی ئەو ئیجازەی مەلایەتییان وەرگرتووە، لەگەڵ ئەوەشدا دەیان کتێبی نووسیوە و چەندین پەڕاو و پەراوێز و راڤەی لەسەر کتێبە زانستییەکان کردووە، پاش خڕکردنەوەی خەرمانێك

---

١. رۆژگاری ژیان: ١٠٧.

لە زانستی عەقڵی و نەقڵی لە بڕواری ١٩٥١ی زایینی مەدرەسەی بیارە بەجێ دێڵێ و دێتە سلێمانی و لە مزگەوتی "حاجی حان" دادەمەزرێ و ماوەی چوار ساڵ حوجرەو مەدرەسە و ئیجازەدان بە فەقێ و مەلای بەردەوام ئەبێ پاشان لە ساڵی ١٩٥٥ لە سلێمانییەوە ئەگوێزێتەوە بۆ تەکیەی شێخ جەمیلی تاڵەبانی لە کەرکووك و ماوەی پێنج ساڵیش لەوێ خەریکی تەدریس و نووسین و ئیجازەدان بە فقێیان دەبێ، لەم ماوەیەی کە لە تەکیەی شێخ جەمیلدا دەبێ بە هۆی هەبوونی دەرفەت و سەرسووك بوونی دەتوانێ چەندین کتێبی بەنرخی وەك شەریعەتی ئیسلام و «الوسیله في شرح الفضیله» و چەند کتێبی‌تر دابنێ و پێشکەش بە گەلەکەی بکات، پاشان لە ساڵی ١٩٦٠ دەچێتە بەغدا و لە مزگەوتی «جامع احمدی» بە ناوی پێش‌نوێژ و وتەبێژ، وە لە مەدرەسەی شێخ عەبدولقادری گەیلانی بە ناوی وانەبێژ دائەمزرێ، پاشان لە ساڵی ١٩٦٤ مزگەوتی «جامع احمدی» بەجێ‌دێڵێ و دەبێتە وانەبێژ و پێش‌نوێژی مزگەوتی شێخ عەبدولقادری گەیلانی و تا وەفاتی فەرموو لەو شوێنە پیرۆزەدا مایەوە و بەرەکاتی ئەنفاسی کەریمەی رۆحی شێخ عەبدولقادری گەیلانی هێمنی‌بەخشی رۆح و دەروونی مامۆستا بوو، بۆیە بەو شەوق و زەوقەوە بەردەوام هەر خەریکی نووسین و دەرس‌وتنەوە و خزمەت بە موسوڵمانان بوو.

بەڵێ مامۆستا چرایەکی پرشنگدار بوو کە زۆر مرۆڤی خواپێداو توانیان کەڵکی لێ‌وەرگرن، ئەم زاتە تایبەت بە گەل و نەتەوە و هۆزێك نەبوو ـ هەرچەند گەلی کورد زۆرترین کەڵکیان لێ‌وەرگرت ـ بەڵکوو پەیوەندی بە هەموو نەتەوەی ئیسلامی بوو، بۆیە لە زۆرێك لە وڵاتە عەرەبی و ئیسلامییەکانەوە ئەهاتنە بەغدا و چۆکی شاگردییان لە خزمەتیدا دادەدا و بەهرەیان لێ دەبرد.

پاشان دوای تێپەڕ کردنی ١٠٢ ساڵ تەمەنی پڕ بەرەکەت و نوورین و پێشخستنی ئەو هەموو سەدەقەی جارییە (کە ئینشائەڵڵا تا قیامەت جارییە) لە شەوی ٢٩ لە

سەر ٣٠ی ٨ / ٢٠٠٥ی زایینی دڵە پاکەکەی لە لێدان وەستا و نەفسی موتمەئیننەی بۆ حوزووری خوا و شوێنی هەمیشەیی گەڕایەوە و حەدیسی پێغەمبەر ﷺ: «خیرکم من طال عمره و حسن عمله» داگری حاڵی بوو، خودا بە میهرەبانی خۆی لە بری هەموو موسوڵمانێك جەزای خێری بداتەوە و بە لوتفی خۆی جێگەی پڕبکاتەوە، آمین یا أرحم الراحمین.

تـلك المـنازل و الآثـار و الطـلل ... مـخبرات بـأن القـوم قـد رحـلوا
سـاروا و قـد بـعدت عـنا مـنازلهم ... فـالآن لا عـوض و لا بـدلُ
فـسرت شـرقاً و غـرباً فـي تـطلبهم ... و كـلما جـئت ربـعاً قـيل لي رحـلوا
فـحين أيـقنت أن الوصـل مـنقطع ... و أنـه لیس لي فـي وصـلهم أمـلُ
رجعت و العين عبرة و الفؤاد شجي ... و الحزن بي نازل و الصبر مرتحلُ

**هەندێك لە سیفاتی مامۆستا:**

لە ناو هەموو خسڵەتە بە نرخەکانی مامۆستادا وەفاداری و بەئەمەکبوونی لە هەموویان باڵای بەرزترە، ئەوەتە لە کتێبەکانیدا ئەبینین کە هەر کەسێك بچووکترین خزمەتی پێ کردبێ وەفای لەبیر ناچێ و ناوی خێری لێ‌ئەبات، بە تایبەت لە دوو بنەماڵەی قەرەداغی و خانەدانی شێخانی بیارە، وە لە ناو ئەم دوو بنەماڵەیشەدا بە تایبەت شێخ عومەر ناسراو بە ئیبنولقەرەداغی و شێخ عەلائەددینی بیارە، کە بە راستی لە دوو رشتەی عیلم و عیرفاندا کاردانەوەی ئەم دوو گەورە پیاوەی لەسەر دیارە، چونکە ئەم دوو گەورە پیاوە مامۆستای زاهیر و باتینیی بوون. هەروەها شێخ جەمیل و بنەماڵەکەی کە ئەو ماوەیە لە تەکیەی تاڵەبانی لە شاری کەرکوکدا بووە رێزو حورمەتیان لێ‌گرتووە و ئەمیش ئەفەرمێ: هەتا مردن فەرامۆشیان ناکەم.

شەرم و حەیای بەرز یەکێکی‌تر لە خسڵەتەکانی مامۆستایە، شەرم و حەیا لە کردار و گوفتار و دەست و پێنووسدا، قەت نەبیسراوە کە مامۆستا بە کردەوە، یان بە زمان، یان بە پێنووس دڵی موسوڵمانێک، یان هاوزمانێکی رەنجاندبێ، وە تا دوایین کاتی ژیانی یەکرەنگ و یەکفیکر و یەکمەرام بەس ئامانجی خزمەت بە نەتەوەکەی و ئایین و بیرو باوڕەکەی بوو، وەك عەرەب دەڵێن: «ظَلَّ راهِباً في مِحْرابِ فِكْرِهِ حَتّىٰ لَبّىٰ نِداءَ رَبِّهِ».

سەبر و خۆگری و رەزا بە قەزا خسڵەتێکی‌تری ئاشکرای مامۆستایە، ئەوەتە لەگەڵ ئەو هەموو چەرمەسەری و ئاوارەیی و بێ‌خانە و لانەیی و فەقر و نەدارییەدا لە وچان ناکەوێ و تا زمانی تەڕە پێنووسیشی تەڕ و پاراو دەبێ و بۆ کردنەوەی زۆرێك لە گرێ کوێرەکانی ژیانی پشت بە خوا دەبەستێ و عیزەت و رێزی خۆی بۆ هیچ گرفتێك ناخاتە مەترسییەوە و دراو گەردنی بەرزی پێ خوار ناکات.

## نووسراوە لە چاپدراوەکان و دەسنووسەکانی مامۆستا:

**عەرەبییە چاپکراوەکان:**

١. إرشاد الأنام إلى أركان الإسلام. ٢. إرشاد الناسك إلى المناسك. ٣. إسناد الأعلام. ٤. إعلام بالغيب و إلهام بلاريب. ٥. الأنوار القدسية في أحوال الشخصية. ٦. الفرائد الجديدة (٢ بەرگ). ٧. القصيدة الوردية في سيرة خير البرية. ٨. الوردة العنبرية في سيرة خير البرية. ٩. الوسيلة في شرح الفضلية. ١٠. جواهر الفتاوى (٣ بەرگ). ١١. جواهر الكلام في عقايد أهل الإسلام. ١٢. خلاصة جواهر الكلام. ١٣. رسائل الرحمة في المنطق و الحكمة. ١٤. رسائل العرفان. ١٥. صفوة اللآلي. ١٦. علماؤنا في خدمة العلم و الدين. ١٧. مواهب الرحمن في تفسير القرآن (٧ بەرگ). ١٨. نور الإسلام. ١٩. نور الإيمان. ٢٠. البركات الأحدية في شرح الصمدية.

**دەسنووسە عەرەبییەکان:**

١. أقصى الأماني في علم المعاني. ٢. الجوهر النضيد في علم التجويد. ٣. المناجاة عند قاضي الحاجات. ٤. بدر العلاة في شرح المقولات. ٥. قصيدة. ٦. قصيدة وسيلة النجاة . ٧. قصيدة وسيلة الهدى. ٨. منظومة بيان كالعيان. ٩. منظومة جواهر الكلام. ١٠. خلاصة منظومة جواهر الكلام في عقيدة الإسلام. ١١. منظومة فرقة الناجية. ١٢. العلمان في العلمين. ١٣. العقد الذهب في جيد الأدب. ١٤. خلاصة التبيان. ١٥. الصرف الواضح. ١٦. كشف الغامض من أحكام الحائض.

**چاپکراوە کوردییەکان:**

١. باخچەی گوڵان. ٢. بارانی رەحمەت. ٣. بەهار و گوڵزار. ٤. بنەماڵەی زانیاران. ٥. شەرحی تەسریفی زەنجانی. ٦. سەناو سکاڵا. ٧. حەجنامە (بە شێوەی دەسنووس لە چاپ دراوە). ٨. دوورشتە. ٩. دیوانی فەقێ قادری هەمەوەند. ١٠. دیوانی مەحوی.

١١. دیوانی نالی. ١٢. دیوانی مەولەوی. ١٣. ڕێگای بەهەشت. ١٤. ڕێگەی ڕەهبەر. ١٥. سەرچاوەی ئایین (شەش پەرتۆکی جیا جیایە: ١. ئیمان و ئیسلام. ٢. ئەساسی سەعادەت. ٣. ئاوی حەیات. ٤. چلچرای ئیسلام. ٥. نوور و نەجات. ٦. ئیقباڵ نامە). ١٦. نووری ئیسلام. ١٧. شەریعەتی ئیسلام (چوار بەرگ). ١٨. شەوچەرەی دڵدار. ١٩. شەرحی عەقیدەی مەرزییە. ٢٠. نووری قورئان. ٢١. لە پەنای ڕەهبەر. ٢٢. وتاری ئایینی. ٢٣. مەولوودنامەو میعراجنامە. ٢٤. مەکتووباتی کاك ئەحمەتی شێخ (چوار بەرگ). ٢٥. نامەی بەختیار. ٢٦. یادی مەردان (دوو بەرگ). ٢٧. شەرحی فەتحولقەریب. ٢٨. بەدیع و عەرووزی نامی. ٢٩. قەسیدەی «نور الصباح». ٣٠. تەفسیری نامی (حەوت بەرگ). ٣١. خولاسەی تەفسیری نامی (سێ بەرگ)

**دەسنووسە کوردییەکان:**

١. بەهارستانی مەولانای جامی. ٢. ڕۆژگاری ژیان. ٣. لیمۆی مەزەدار. ٤. سۆسەنی کۆسار. ٥. نامەی حەقیقەت. ٦. وەنەوشەی نازدار. ٧. پەیڕەوان (باسی خەلیفەکان و کوڕەکانی شێخ عوسمانی تەویڵە ئەکات). ٨. باخچەی مەعریفەت. ٩. شەمامەی بێندار. ١٠. شەرحی دیوانی سالم. ١١. شەرحی دیوانی بێسارانی. ١٢. باوەشێنی دڵ بە چەند بەستەی گوڵ. ١٣. کەراماتی حەرزەتی زیائەددین.

**چاپکراوە فارسییەکان:**

١. شمشیر کاری بر نسیم رستگاری. ٢. فوائد الفوائح.

**دەسنووسە فارسییەکان:**

١. شهاب سما در رجم جن جان نما. ٢. فیوضات خدای ذی من. ٣. گلزار حکمت در رباعیات فارسی. ٤. هۆنراوەیەکی فارسی لە عیلمی تەجویددا. ٥. راهِ رحمت حق (شیعری فارسی).

ئەوە گرنگ نییە کە بە هۆی پاڵپشتی نەتەوەیەك تاکە کەسێك یان بنەماڵەیەك ناودار ببێت و ڕێی بووژانەوەی بۆ هەموار بکرێت، موهیم ئەوەیە تاکە کەسێ یان بنەماڵەیەك ببێتە هۆکاری بووژانەوەی فەرهەنگ و بێدار کردنەوەی نەتەوەیەك، کە نووسین و دانانی ئەم هەموو کتێبە لە لایەنی مامۆستا عەبدولکەریم و چەندەهای کتێبی‌تر لە لایەنی کوڕەکانیەوە توانیویانە تا ڕادەیەك ئەم ڕاستییە بسەلمێنن و جۆگەیەك بخەنە سەر ڕووباری کلتووری نەتەوەکەمان کە بەو هیوایە چینی دوای مامۆستا بتوانن ئەم ڕووبارە بگەیەنن بە دەریا.

**تەفسیری نامی:**

تەفسیری نامی یەکەمین تەفسیرێکە کە بە زمانی سادە و ساکاری کوردی نووسراوە و تەواوی تایبەتمەندییەکانی تەفسیری لە خۆگرتووە، وەك: هۆی هاتنەخوارەوەی ئایەکان و ناسیخ و مەنسووخ و هێنانی حەدیس و ئەسەر و شەرح و راڤەی ئایەتەکانی ئەحکامی فیقھ و چەندین بابەتی کەلامی و فیقهی، ئوسولی فیقهی، مەنتیقی، بەلاغی، مێژوویی و...، وە جگە لەمانە لە زۆرشوێنا بە هۆنراوەی جوان و بە مانا تام و چێژێکی تایبەتی پێبەخشیوە، کە ئەمانە هەموو هۆکارن بۆ بەسەرداهەبوونی ئەم تەفسیرە بەسەر هەموو تەفسیرە کوردییەکان و بگەرە بەسەر زۆرێك لەو تەفسیرانەی کە لەم چەرخەدا بە زمانەکانیتر نووسراون، چونکە توانیویەتی وەلامی ئەو گومان و رەخنەیانە بە بەلگەی سەلمێنراو بداتەوە کە لەسەر هەندێ ئایەت یان هەندێ بابەتی قورئانی وتراون، وە شێوازی دارشتنی رستەکانی بە شێوەیەك سادە و رەوانە کە ئەتوانێ هەموو چین و توێژێکی تینوو بە سەرچاوەی ئاوی حەیاتی کەلامی خودا تێراو بکات، ئینجا ئەم هەموو تایبەتمەندیانە و پێویستی برایانی هاوزمانمان بەم تەفسیرە بە نرخە بوونە هۆکاری ئەوە کە بلاوکردنەوەی کوردستان لە سەر ئیزن و رێدانی کەتبی و نووسراو لە لایەن بنەماڵەی مامۆستا، هەڵسێ بە چاپکردنەوەی دووبارەی ئەم تەفسیرە بە شێوەیەکی ناوازە کە ئەم تایبەتمەندییانەی خوارەوەی لە خۆی گرتووە:

١. پیتچنی نوێ و نووسینەوەی لەسەر رێنووسی باوی باوڕپێکراوی ئەمڕۆ، بەم شێوە کە: ئەو وشانەی کە بە رێنووسی عەرەبی نووسرابوون گوڕدراون بە رێنووسی کوردی، هەروەها ئەو وشە عەرەبییانەی کە پیتی عەرەبییان تێدا بووە وەك (ث، ذ،

ص، ض، ط، ظ) یان خراونەتە ناو جووت کەوانەوە، یان بە پیتی کوردی (س، ز، ت) نووسراونەتەوە.

٢. لە هەندێ شوێندا کە بە پێویست زانرابێ بە ئیمزای "بڵاوکردنەوەی کوردستان" بۆ زیاتر روونکردنەوەی بابەتێك هەندێ پەراوێز نووسراون،

٣. لە نووسینەوە و دانانی قورئانەکەدا لە خەتی عوسمان تاها کەڵکمان وەرگرتووە، چونکە هەم بێهەڵەیە و هەم شارەزایی بەم شێوە خەتە زۆرترە.

٤. دەرهێنان و نووسینی ژمارەی ئایەت و نێوی سوورەتی ئەو ئایەتانەی کە مامۆستا بۆ نموونە و میسال هێناونیەتەوە.

٥. دانانی شێوەکانی ﷺ و عليه السلام و رحمه الله رضي الله عنه و... لە جێی (د. خ) و (ر. خ) و...

٦. ئەوپەڕی هەوڵ و کۆششمان ئەوە بووە کە دەقاودەق ئەوەی مامۆستا نووسیویەتی لێرەدا لەبەر چاوی بگرین و بینووسینەوە، ئەگەریش وشەیەك یا رستەیەك بە پێویست زانرابێت کە زیاد بکرێت، خراوەتە نێو کەوانی گۆشەدارەوە ([ ]) وە بچووکترین گۆڕانکارییەك ئەگەر کرابێ لە پەراوێزدا ئاماژە بەو دەسکارییە کراوە.

لەبیری ناکەین زەحمەت و تەلاشی مامۆستا و نووسەری بەرزی کورد جەنابی مامۆستا موحەممەد عەلی قەرەداغی ـ خوا تەمەن درێژی بکات بۆ خزمەتی زیاتر بە گەل و نەتەوەکەی ـ کە دەورێکی بەرچاوی لە ئامادەبوون و لە چاپدانی تەفسیری نامی (چاپەکەی بەغدا)دا بووە و زەحمەتی زۆری تیاکێشاوە هیوای سەرکەوتنی بۆ ئەخوازین. وە لە ئامادەبوونی ئەم چاپەشدا کۆمەڵێك لە مامۆستایان و برایان زەحمەتیان کێشاوە کە جێی خۆیەتی ناویان لێ‌ببەین و دەست‌خۆشانەیان پێ‌بڵێین، کە بریتین لە بەڕێزان:

١. مامۆستا مەلا عەبدوڵڵا فاتیحی (کەرجۆیی ـ سنە).
٢. کاك سیروان رەحمانی (سەلاس و باوەجانی).
٣. مامۆستا مەلا سدێق فاتیحی (کەرجۆیی ـ سنە) .
٤. مامۆستا مەلا ناسیح فەتتاحی (نژماری ـ مەریوان).

کە ئەم برایانە و هەندێ بەڕێزی‌تر لە خوێندنەوەی چەندین جار و هەڵەگریدا زەحمەتی زۆریان کێشاوە، سەربەرزی و سەرکەوتنیان لە خوای گەورە ئاواتەخوازین، وە لە هەموو خوێنەرێکی بەڕێز و خۆشەویست داواکارین کە منەت بنێتە سەرشانمان و هەڵەچاپییەکانی ئەم کتێبەمان بە دیاری بۆ بنێرێ، تا ئینشائەڵڵا لە داهاتوودا بتوانین بە پاك و خاوێنی لە چاپی بدەینەوە و دڵی ئێوە و رۆحی پیرۆزی مامۆستا لە خۆمان رازی بکەین.

**بە سپاسەوە ـ بڵاوکردنەوەی کوردستان**
**(رەئووف مەحموودی)**
**سنە ـ ١٣٨٩ ك هـ ـ ٢٠١٠ز.**

**ئەی ساحیب گوفتار لە سەرای غەیبی　　بە «أنا عند ظن عبدي بي»**
**تۆماری عومرم ئەڕوانم پێیدا　　قوسووری زۆرە و خێر کەمە تێیدا**
**هەرچەن لەم وەزعە زۆر هەراسانم　　ئومێدەواری عەفو و ئیحسانم**
**سا حوسنی زەننم بە حەق بێنە جێ　　زۆر خۆشە خودا لە بەندە خۆش بێ**
**بمبەخشە بە شای هەموو ئەنبیا　　بە سەفای قەلبی مەولای ئەسفیا**
**حەل بکە بەخێر گشت موشکیلاتم　　بۆم ئاسان بکە رێگەی نەجاتم**
**تەوفیقم بدە بۆ ئیستیقامەت　　لەسەر تەریقی سیدق و سەلامەت**

**«نامی»**

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿إنّ هذا القرآن يهدي للتي هي أقوم﴾

تـەفسیری نـامی دەلیـلی دیـنە کـلیلی دەرگـای پـیرۆزی ژیـنە

ڕێنومای ژیرە لە گەلی کوردان بۆ فامی مەعنای ئایاتی قورئان

**پێشەکی نووسەر**

پاش ستایشی پەروەردگار و دروودی بێ‌ژمارە بۆ گیانی ڕەهبەری نازار و بۆ گیانی خانەنشینان و خوێشان و یاران و پەیڕەوانی.

ماوەیەکی زۆرە لە دڵمایە کە خزمەتێ بە قورئانی پیرۆز بکەم کە خزمەتیش بێ بە هاونیشتمانانم و لە سەر زمانی خۆمان دارِژرێ تا عام و خاس سوودی لێ‌وەربگرن. لە حەمدی خواوە لە مانگی دەی ساڵی هەزار و نۆسەد و حەفتا و حەوتی میلادییەوە لە سەر ئەوەی لە دڵما بوو موەفەق بووم و خودا بە میهرەبانی خۆی یارمەتی دام بە ساغی لەش و ئاسایشی دڵ و دووری لەو شتانە کە بەرانگاری خزمەت ئەبن و، دەستم کرد بە نووسینی ئەم تەفسیرە کە لێرەدا پێشکەشی ئەکەم.

وە من ئەم کارە گەورەم دەست پێ‌کرد بە ئومێدەواری ڕێژەنی پیرۆزی بەسەر دڵما نەك بە زانیاری خۆما بنازم؛ چونکی عولوومی قورئان دەریای بێ‌پایانە و بۆ ئێمە پێویستی بە زانینی عولوومی عەرەببیە و، عیلمی تەفسیر و، فیقهـ و، حەدیسی شەریف هەیە، وەکوو پێویستی هەیە بە ئیلمامێکی موناسب بە تەواریخی عالەمی جیهان لە ئیسلامی و غەیرە ئیسلام. وە زۆربەی دافیعم بۆ ئەم تەفسیرە ئەمە بوو پیاوە عالمە تەفسیر زانەکان زۆر کەمن، وە ئەگەر یەکە یەکەیێ ببێ مەجالی نووسین و چاپکردنی ئەم جۆرە کتێبەیان نییە و، ئەوەندەیش حاڵی بووم کە زۆر نزیکە کەسانێ دەس بکەن بە تەفسیری قورئان کە ئەسبابی ئیشەکەیان تەواو نەبێ.

جا دەستم کرد بەم کارە موبارەکە و چەند تەفسیری جیاجیام حازر کرد، وەکوو تەفسیری «ابن‌کثیر» و تەفسیری «کشاف» و «ئیمامی رازی» و «بیضاوي» و «قرطبي» و «خازن» و «بغوي» و «روح المعاني» و «روح البيان» و «جلالين» و حاشیەی «جمل» و «صاوي» و «منار» و «في ظلال القرآن» و «جواهر المعاني» مەشهوور بە «طنطاوي» و غەیری ئەوانەیش.

وە لەم تەفسیرەدا کە نووسیومە تەماشای چەن شتم کردووە:

١. لە دارشتنی کتێبەکەدا ئیعتیدالم گرتووەتەبەر: نە زۆر کورت و نە زۆر درێژ.

٢. لە هەر ئایەتێکدا ئەحکامی شەرعی ببێ لە سەر یاسای مەزهەبی ئیمامی شافیعیﷺ بەیانم کردوون؛ چونکی هاونیشتمانەکانم لە سەر ئەم مەزهەبەن.

٣. لە باسی نازڵ بوونی ئایەتەکاندا هەرچی لە حەدیسی سەحیحدا ببێ بە زۆری نووسیومە.

٤. لە هەر شوێنێکا ئیشکالێ هەبێ بە موتالەعەی ئەو تەفسیرانەوە گەڕاوم بۆ حەلی ئەو ئیشکالە بە قەی تەوانای خۆم و ئەوەی بۆم کراوە بۆ لابردنی ئیشکالەکە کردوومە و نووسیومە.

ئیتر زۆر موحتاج و نیازمەندم بە دوعای هەموو برادەرێکی ئیسلامی بۆ ئەوە کە بە میهرەبانی خودای تەعالا لە دنیادا موەفەق بم و لە قیامەتیشدا خودا لێمان خۆش بێ.

**عبدالکریم محمد مدرس**

**وتەیەك**

مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس گەلێ لایەنی کتێبخانەی کوردیی دەوڵەمەند کردووەتەوە و، بە بەرهەمی بەنرخ و جوان زۆر کەلێن و بۆشایی پڕ کردووەتەوە. ئەمە تێکڕا. بە تایبەتیش خزمەتێکی زۆری موسوڵمانانی گەلی کوردی کردووە و، زۆر سەرچاوەی روونی بێگرێ و ئاسانی بە زمانی خۆیان پێشکەش کردوون.

قورئانی پیرۆز کە یەکەم سەرچاوەی ئایینی ئیسلامە و موسوڵمانان هەمیشە لە خزمەتیدا دەژین تا ئێستە تەفسیرێکی تەواوی بە زمانی کوردی نەخراوەتە بەردەستی موسوڵمانانی گەلی کورد. هەر وەها کتێبخانەی کوردیش تا ئێستە جێگەی ئەم سەرچاوە گرنگ و گەورەی بە بۆشی ماوەتەوە. ئەم کارەی مامۆستای مودەڕڕیس بە هانای ئەم دوو لایەنە گرنگەوە دێت.

مامۆستای مودەڕڕیس داوای لێکردم نووسینەوە و سەرپەرشتی چاپی ئەم تەفسیرە بگرمە ئەستۆ. هەرچەند ئەمە کارێکی گران و گەورەیە، نەمتوانی سەرپێچی لە فەرمانی مامۆستا بکەم و شانم دایە بەر. لە خوا ئەخوازم تیا سەرکەوتوو بین.

**موحەممەد عەلی قەرەداغی**

## سووره‌تی فاتیحه
### له مه‌ککه‌دا هاتووه‌ته خواره‌وه و حه‌وت ئایه‌ته

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ١﴾

هه‌ر به پیرۆزی ناوی ئه‌و خوداوه که میهره‌بانه له‌گه‌ڵ هه‌موو گیانله‌به‌رانا ده‌ست ئه‌که‌م به‌م ئیشه که مه‌به‌ستمه بیکه‌م.

﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٢﴾

. هه‌موو ستایش و سوپاسێ شیاوی ئه‌و خوایه ئافه‌ریننده و په‌روه‌ردگاری هه‌موو شتێکه له‌وانه‌ی په‌یدا بوون و په‌یدا ده‌بن.

﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ٣﴾

ئه‌و خوایه که میهره‌بانه.

﴿مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ٤﴾

دارای هه‌موو تۆڵه و پاداشێکه له پاشه‌ڕۆژا.

﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ﴾

ئه‌ی په‌روه‌ردگاری میهره‌بانی دارا! به‌نده‌یی هه‌ر بۆ تۆ ئه‌که‌ین.

﴿وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ٥﴾

وه هه‌ر له تۆ داوای یارمه‌تی ئه‌که‌ین.

﴿ ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ٦ ﴾

ئەی خودا! شارەزاییمان بکە بۆ ڕێگەی ڕاست.

﴿ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ ﴾

بۆ ڕێگەی ئەو کەسانە کە بە میهرەبانی خۆت هۆی ئاسایشی نەبڕاوەت پێداون.

﴿ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ٧ ﴾

ئەوانەی کە جیاوازن لەو کەسانە کە ڕقت لێ‌گرتوون لە بەر بیر و باوەڕی نابار و کردەوەی ناپەسەند. وە ئەوانەی ڕێگای ڕاستیان ون کردووە.

**«آمین»**

خودایە ئەم پاڕانەوەمان بە میهرەبانی لێ‌وەربگرە.

## سوورەتی مەککەیی و سوورەتی مەدینەیی:

ئەهلی تەفسیر لەسەر ئەو بڕیارەن هەر ئایەتێ لە پێش کۆچکردنی حەزرەتا ﷺ لە شاری مەککەوە بۆ شاری مەدینە هاتبێتە خوارەوە ئەوە بە مەککەیی ئەناسرێ. وە هەر سوورەتێ لە پاش کۆچ هاتبێتە خوارەوە ئەوە بە مەدینەیی ئەناسرێ. لە سەر ئەم بڕیارە «سوورەتی فاتیحە» بە مەککەیی ئەناسرێ.

## هۆی هاتنە خوارەوەی سوورەتی فاتیحە:

کۆمەڵی زاناکان لە سەر ئەوەن ئەم سوورەتە پیرۆزە لە پاش پێنج ئایەتی ئەووەڵی سوورەتی «علق» هاتووەتە خوارەوە.

بۆ ڕوون کردنەوەی ئەم باسە: حەزرەت ﷺ چەن ساڵێ لە پێش ئەوەدا کە ببێ بە پێغەمبەری خودا لە مانگی ڕەمەزانا ئەڕۆیشتە ئەشکەوتی حیرا، کە دوو فەرسەخ

لە شاری مەککەوە دوورە، لەوێدا خەریکی بیر کردنەوە ئەبوو لەوەدا کە ئەم جیهانە پێویستە پەروەردگارێکی زانا و تەواناى ببێ و پێویستە ئادەمیزاد بیپەرستن و بۆ هیچ شتێکی دەستکار ملکەچ نەبن و پێویستە ئادەمیزاد ئایینێکی راستیان ببێ بە جۆرێ هۆی ئاسایشی گشتی بێ و کەس لە ناز و نیازی خۆی بێبەش نەکا و پێویستە دادگایێ ببێ کە لە رۆژی خۆیدا هەرکەسێ بگەیەنێ بە تۆڵەی خۆی.

ئەم وەزعە تا تەمەنی چل سالی دەوامی کرد. لەو ساڵەدا لە ئەووەڵی مانگی «ربيع الأول»ەوە، کە مەشهوورە بە مانگی مەولوود، خودای گەورە خەلاتی کرد بە پێغەمبەرێتی، بەلام هەر خەوی راست و رەوانی ئەبینی بە جۆرێ هەرچی لە خەودا ئەدی لە رۆژا بە ساغی ئەهاتە پێش چاوی.

بەم شێوە شەش مانگ مایەوە کە مانگی رەمەزان هات بە یاسای پێشوو تەشریفی رۆیشتەوە بۆ ئەشکەوتی حیرا و لە سەر شێوەی پێشووی خۆی کاتی رائەبوارد. تا شەوی هەژدەی رەمەزان. جا بە فەرمانی خوای تەعالا جوبرەئیلی ئەمین هاتەخوارەوە بۆ سەری و حەزرەتیﷺ وشارد بە سنگیەوە جا بەری دا و فەرمووی: بخوێنە! حەزرەتﷺ لە وەلاما فەرمووی: خوێندەوار نیم. بۆ جاری دووەم، وشاردیەوە بە خۆیەوە و بەری داوە و فەرمووی: بخوێنە! ئەویش دووبارە فەرمووی: خوێندەوار نیم. بۆ جاری سێهەم وشاردیەوە بە خۆیەوە و فەرمووی:

﴿اقرأ باسم ربك الذي خلق ۝١ خلق الإنسان من علق ۝٢ اقرأ و ربك الأكرم ۝٣ الذي علم بالقلم ۝٤ علم الإنسان ما لم يعلم ۝٥﴾. [سوورەتی عەلەق].

یانی، فەرماننامەی خوای گەورە بخوێنەرەوە بە یارمەتی و پیرۆزی ناوی ئەو پەروەردگارە تەواناى زانایە کە هەموو شتێکی دروست کردووە و ئەم ئادەمیزادە خاوەن زانست و هۆش و هونەرەی لە تنۆکێ خوێنی بێمایە و بێگیان و بێنرخ دروست کردووە.

ئایەتی خوای خۆت بخوێنەرەوە و باوەڕت وابێ کە خودای تۆ گەلێ خاوەن دەست و پایەیە و هەرچی بویێ ئەیکا. خوایەکی وایە ئادەمیزادی فێری زانست و پیشەی نایاب و بەسوود کردووە بە هۆی نیشاندانی نووسین بە قەڵەم (خامە)وە و ئادەمیزادی فێری ئەو شتە بەکارانە کردووە کە ئەگەر ئەو فێری نەکردایەن قەت نەیانئەزانی و پێش ئامادەکردنی هۆی زانست و فێر بوون بۆیان، نەیانزانیوە.

پاش ئەمە حەزرەت ﷺ بە مووچڕکەی لەشەوە لە ئەشکەوتەکە دەرچوو گەڕایەوە بۆ ماڵەوە و بە حەزرەتی خەدیجەی خێزانی رضي الله عنها فەرموو: دامپۆشە! ئەویش دایپۆشی. پاش ئەوە کە دڵی هێمن بووەوە هەستا و کارەساتی ئەشکەوتی حیڕای بۆ خەدیجە گێڕایەوە و فەرمووی: ترسم لە خۆم پەیدا کردووە نازانم چیم بە سەر دێ؟ خەدیجە لە وەڵاما عەرزی کرد: نە، نە، مەترسە و موژدە بێ لێت. بە خودا قەسەم! خوا هەرگیز تۆ رسوا ناکات. تۆ ئینسانێکی لەگەڵ خزم و خوێشانا میهرەبانی و وتەت راستە و باری ئازاری خەڵك ئەخەیتە سەرشانی خۆت و میوانداری ئەکەی و هەرکەس لێ‌قەوماو بێت یارمەتی ئەدەیت.

پاش ئەمە خەدیجە فەرمووی: با بڕۆین بۆ لای «وەرەقەی کوڕی نەوفەل»ی ئامۆزام ـ کە پیرێکی ژیر و خاوەن فام و ئاگاداری ئایینی نەسارا بوو ـ رۆیشتن بۆ لای و حەزرەت ﷺ کارەساتی خۆی بۆ گێڕایەوە، ئەویش لە وەڵاما فەرمووی: موژدەبێ ئەوەی لەو ئەشکەوتەدا هاتووەتە لات ئەو فریشتە پیرۆزەیە کە هاتووە بۆ لای حەزرەتی مووسا و حەزرەتی عیسا و تۆ ئەگەی بە پایەیەکی بەرز. خۆزگە لەو کاتەدا تۆ ئەم پەیامی خودا بەسەر خەڵکا ئەخوێنیتەوە و ئەوانیش ئازارت ئەدەن و لە مەککە دەرت ئەکەن من بمامایە هەتا یارمەتییەکی باشم بدایتایە!

حەزرەت ﷺ فەرمووی: بۆچی خزمانی من ئازارم ئەدەن و لە مەککە دەرم ئەکەن؟ وەرەقە وتی: بەڵێ، هیچ کەسێ لە پێغەمبەران نەبووە کە بێت ئامۆژگاری

گەلی دەوروبەری خۆی بکا و ئازار و مەینەت لەوانەوە نەبینێ. ئەمە یاسای ئادەمیزادە لەگەڵ پێغەمبەرانا.

پاش ئەمە وەرەقە فەرمووی بە حەزرەت ﷺ: ئەمجارە کە بانگی ئەو فریشتەیەت بیست خۆت رابگرە و چی ئەڵێت بە دڵێکی ئارامەوە وەری بگرە. پاش ئەمە بە چەن رۆژێ حەزرەت ﷺ لە دەرەوە بوو جوبرەئیل بانگی کرد: یا موحەممەد! ئەمیش وەڵامی داوەو فەرمووی: «لبّيك». جوبرەئیل فەرمووی: «بسم الله الرحمن الرحيم. الحمد لله رب العالمين». تا ئاخری سوورەتی فاتیحەی بە سەردا خوێندەوە. بینا لەسەر ئەمە ئەووەڵ سوورەتێ پاش پێنج ئایەتەکەی سوورەتی «علق» هاتبێتە خوارەوە سوورەتی فاتیحەیە. وە لە ریوایەتێ‌ترا ئەڵێت: سوورەتی فاتیحە لە کاتی فەرز بوونی نوێژا هاتووەتە خوارەوە.

بە هەر حاڵ ئەوەی کە لە لای زانایانی دین باوەڕ پێ‌کراوە ئەمەیە کە سوورەتی فاتیحە لە شاری مەککەی موکەڕڕەمەدا هاتووەتە خوارەوە و ریوایەتی یەکەم بەهێزترە.

**ژمارەی ئایاتی سوورەتی فاتیحە:**

ئەم سوورەتە حەوت ئایەتە و لە سەر بیری قورئان‌زانانی مەککە و کووفە و زۆربەی عالمانی حیجاز، یەکەم ئایەتی «بسم الله الرحمن الرحيم»ە و ئیمامی شافیعی لەسەر ئەمەیە بە چەن دەلیل:

یەکەم: «أم سلمة» ﵂ ریوایەت ئەکا کە حەزرەت ﷺ فاتیحەی خوێندووە و«بسم الله الرحمن الرحيم»ی بە ئایەتێك لەم سوورەتە ژماردووە.

دووەم: ئەبووهورەیرە ﵁ ریوایەتی کردووە لە حەزرەتەوە ﷺ کە فەرموویەتی: فاتیحە حەوت ئایەتە، یەکەمیان «بسم الله الرحمن الرحيم»ە.

سێهەم: ئەبووبورەیدە ﷛ لە باوکیەوە ریوایەت ئەکا کە حەزرەت ﷺ فەرموویە: پێت ئەڵێم کە ئایەتێ هەیە لە پاش حەزرەتی سولەیمانی کوڕی حەزرەتی داوود خودا نەیناردووە بۆ کەس بۆ من نەبێ؟ عەرزم کرد: بەڵێ. فەرمووی: کە نوێژت دەست پێ کرد چی ئەخوێنیت؟ عەرزم کرد: «بسم الله الرحمن الرحیم» فەرمووی: ئەو ئایەتە ئەمەیە.

چوارەم: ئیمام جەعفەری سادق لە باوکیەوە ریوایەتی کردووە ئەویش لە جابیری کوڕی عەبدوڵلاوە ﷞ فەرموویە: حەزرەت ﷺ فەرموویە کە دەستت کرد بە نوێژ چی ئەخوێنی عەرزم کرد: «الحمد لله رب العالمین». فەرمووی: بڵێ «بسم الله الرحمن الرحیم. الحمد لله رب العالمین».

**حوکمی ئەم سوورەتە لە نوێژا:**

مەزهەبی ئیمامی شافیعی ﵀ لە سەر ئەمەیە فەرزە لەسەر هەموو نوێژکەرێ ئەم سوورەتی فاتیحە بخوێنێ لە هەموو رکاتێکا، بە چاودێری حەرفەکان و مەخرەجیان و گیراوەیان. مەگەر یەکێ لە پێشەوا دوا کەوتبێ ئەوە هەرچەن فریا بکەوێ بیخوێنێ باشە و ئەگەر فریاش نەکەوێ هیچی لێ‌بخوێنێ هەر باشە و مادام لەگەڵ پێشەوادا رکووع ببا رکاتەکەیشی بۆ حسێب ئەکرێ.

**مانای هەندێ کەلیمەی فاتیحە:**

«حمد»: ستایش و سوپاس «رب»: ئافەرینندە، دروستکەر، پەروەردگار، پێگەیێنەری هەرشتێ بەو مایە و پایە بۆی بڕیار دراوە. «عالمین»: جەمعی عالەمە و مانای هەموو نەوعێ لە مەخلووقاتی خوا: گیاندار و بێ‌گیان، هۆشیار و بێ‌هۆش کە خوایان پێ

ئەناسرێ و ئەبن بە رەهنومای بیری ئینسان بۆ خوا دۆزینەوە. «مالك»: دارا و خاوەن کار. «دین»: پاداش و تۆڵەی کردەوە و بیر و باوەڕ. «نعبد»: عیبادەت یانی: فەرمانبەری و، مل کەچ کردن و، رام بوون بۆ خودای تەعالا. «نستعین»: عەون: یارمەتی دانە لە لایەنی خوداوە بۆ بەندە لە هەموو ئیش و کارێکا. «اهدنا»: هیدایەت: شارەزاکردنە بە رێگەی راست و گەیاندنە بە نیازی باش چ بە هۆی تەمێ و تەربییەتی پێغەمبەرانەوە یا مامۆستایانی خوداناس و مەردانی راست و دڵ رووناك یا بیر کردنەوەی ئادەمیزاد بە هۆشی خۆی.

بەرزتر لەمانە ئەمەیە کە خودای تەعالا بە میهرەبانی رووناکی دڵ و سینەگوشادی بدا بە بەندەی خۆی و ئەگەر ئەم رووناکییە لە لایەنی خوداوە نەیێ هیچ شتێ سوودی نابێ.

﴿الصراط المستقيم﴾: رێگەی راست، مەبەست ئایینی ئیسلام و هەموو بیر و کردەوەیەکی راست و بە سوودە. ﴿الذين أنعمت عليهم﴾: مەبەست ئەو کەسانەیە خودای گەورە ناز و نیعمەتی خۆی پێداون لە پێغەمبەران و باوەڕکردوان بە راست و راستی و گیانبازانی راست لە رێگەی راستیدا و هەموو ئادەمیزادێ کە راست و راساڵ بێ. ﴿المغضوب عليهم﴾: ئەوانەن کە خودا رقی لێ گرتوون بە هۆی بیری نابار و کردەوەی ناپەسەندەوە. «الضالين»: ئەوانەن کە رێگەی راستیان ونکردووە. هەر چەند ئەم دوو سیفەتە لە شانی جوولەکە و گاورا هاتوونەتە خوارەوە بەڵام هەموو ئادەمیزادێکی رێونکردوو و خاوەن بیری نابار و کردەوەی ناپەسەندی بەرئەکەوێ.

«آمين» وتنی سوننەتە و لە قورئان نییە. مانای وەرگرتنی ئەم نزا و پاڕانەوەیە کە رابووران.

**پوختەی مانای ئەم سوورەتە:**

هەر بە پیرۆزی ناوی خودای پەروەردگاری میهرەبانەوە دەست بەم مەبەستە ئەکەم، هەرچی ستایش و سوپاسە بۆ ئەو خودایە کە پەروەردگاری هەموو شتێکە، ئەو پەروەردگارە کە میهرەبانە لەگەڵ گیانلەبەرانا، ئەو پەروەردگارە کە خاوەن کارە لە رۆژی تۆڵە و پاداشا. پەروەردگارا! هەر بۆ تۆ بەندەیی ئەکەین و هەر لە تۆ داوای یارمەتی ئەکەین. پەروەردگارا! شارەزاییمان بکەو بمانخە سەر رێگەی راست: رێگەی ئەو کەسانە کە ناز و نیعمەتت پێداون، نەك ئەوانەی کە رقت لێ گرتوون یا رێگەیان ون کردووە. پەروەردگارا! ئەم نزا و لاڵەمان رەوا بکە بە میهرەبانی خۆت.

سورة البقرة، مدنية و هي مائتان و ست و ثمانون آية.

[سووره‌تی به‌قه‌ره، له مه‌دینه هاتووه‌ته خواره‌وه و "٢٨٦" ئایه‌ته]

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿الٓمٓ ①﴾

«اللّٰه أعلم». به‌س خودا مانای ئه‌م وشه ئه‌زانیّ.

﴿ذَٰلِكَ ٱلْكِتَٰبُ﴾

ئه‌و کتێبه به‌زره به سووده که به قه‌ڵه‌می قودره‌ت له «لوح المحفوظ»دا نووسراوه و ده‌ستکراوه به ناردنی بۆ پێغه‌مبه‌ری خودا ﷺ.

﴿لَا رَيْبَ فِيهِ﴾

هۆی گومان و دڵپه‌رێشانی تیا نییه بۆ ئه‌و که‌سه به دڵێکی زانای ئارامه‌وه بیری لیّ بکاته‌وه.

﴿هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ ②﴾

هۆی شاره‌زایی و رێگه‌ناسی ئه‌و که‌سانه‌یه که ئه‌یانه‌ویّ له نافه‌رمانی خودا لاده‌ن.

﴿ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱلْغَيْبِ﴾

ئەوانەیش ئەو كەسانەن كە باوەڕیان هەیە بەوەی پەنهانە و لە پێش چاوا نییە و بە ئاشكرا نازانرێ و باوەڕ پێ‌كردنی هۆی ئەوەیە ئادەمیزاد بە موسوڵمان بناسرێ، وەكوو پەروەردگاری گشتی و فریشتە و فەرمانی خودا و پێغەمبەرەكانی و ڕۆژی پاشەڕۆژ و بەهەشت و دۆزەخ و...

﴿وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ﴾

وە ئەوانەی كە نوێژەكان بە ساغی بەجێ دێنن.

﴿وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ۝٣﴾

وە ئەوانە كە حەقی خودا لە ماڵی خۆیانا دەر ئەكەن بۆ خاوەن حەقەكان و بێجگە لەویش لە رزق و ڕۆزی خۆیان بەشی خەڵك ئەدەن.

﴿وَٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ﴾

وە ئەوانەی كە باوەڕیان هەیە بەو كتێبە نێرراوەتە خوارەوە بۆ لای تۆ.

﴿وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ﴾

وە بەو كتێبانە كە نێرراونەتە خوارێ بۆ لای پێغەمبەرانی پێش زەمانی تۆ.

﴿وَبِٱلْءَاخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ ۝٤﴾

وە ئەوانەی یەقین و باوەڕی ساغیان هەیە بە ڕۆژی پاشەڕۆژ.

﴿أُوْلَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدًى مِّن رَّبِّهِمْ﴾

هەر ئەو كەسانەن كە دامەزراون لەسەر پایەی تێگەیشتن و پێگەیشتن لە لای خوای خۆیانەوە.

﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ٥﴾

وە هەر ئەوانەن کە لە هۆی ئازاری پاشەڕۆژ رزگار بوون و بە مایەی خۆشەویستی خودا گەیشتوون.

**کاتی هاتنە خوارەوەی ئەم سوورەتە:**

بە تێکڕایی بیری زانایانی قورئان لە سەر ئەمەیە کە ئەم سوورەتە یەکەم سوورەتێکە لە پاش کۆچکردنی حەزرەت ﷺ لە مەککەوە بۆ شاری مەدینە لە شاری مەدینەدا هاتووەتە خوارەوە. تەنها ئایەتی دووسەد و هەشتا و یەکەم لە خاکی «منا»دا لە سەفەری حەجی وەداعدا نازڵ بووە. ئەمەیش لەسەر ئەوەی لەمەوپێش نووسیمان مەنعی ئەوە ناکا کە بە ئایەتی مەدینەیی بناسرێت.

وە فەرموویانە: پێنج ئایەتی ئەووەڵی ئەم سوورەتە لە شانی موسوڵمانانا و، دوو ئایەتی پاش ئەوان لە شانی کافرە سەرکێشەکانا و، سیازدە ئایەتی پاش ئەوان لە شانی کافرە دووڕووەکانا هاتوونەتە خوارەوە.

**مانای کەلیمەکان:**

«الم» ئەم کەلیمە و وێنەکانی وەکوو «المر» و «المص» و غەیری ئەوانە لەوانەن کە هەر خودای تەعالا مەعنایان ئەزانێ و ئەو حەزرەتی پێغەمبەری تێگەیاندووە و بەس.

**روون کردنەوەی ئەم باسە:**

ئایەتی قورئان ئەوەی هۆی بیر و باوەڕ و کردەوەی موسوڵمانان بێ، یا باسی سەرگوزەشتەی ئادەمیزادی پێشینان بێ، یا لە موژدەی موسوڵمانان و ترساندنی کافران

و تاوانبارانا بێ و وێنەی ئەمانە، هەمووی بە رووناکی لە لایەنی حەزرەتەوەﷺ مانایان بەیان کراوە و ئەگەر ناکۆکی لە لایەنی زانایانەوە هەبێ لە مانایانا لە بەر ئەوەیە ئەو فەرموودەی حەزرەتەیان بە ساغی پێنەگەیشتووە، یا خود بازێ کەلیمەی چەن مانا هەڵئەگرێ یا لەبەر چەن هۆی‌ترە...

وە ئەوەی لە وێنەی «الم» بێ، یا ئەو ئایەتانەی کە ماناکانیان لەوانە بێ بۆ زاتی خودا دەس نەدا بە «موتەشابەهات» ئەناسرێن وەك خودا خۆی وا ناوی بردوون.

لە بابەتی ئەمانەوە دوو بیر هەیە: بیری پێشینان ئەمەیە کە باوەڕمان هەیە راست و ڕێکن بەڵام لێیان ناکۆڵینەوە و هەواڵەی زانستی خودایان ئەکەین. مەبەستی هەر شتێ بووبێ خۆی ئەزانێ.

وە بیری زانایانی دوایی ئەمەیە: لەسەر رووناکی ئایەتە رووناکەکانەوە مانای باشیان بۆ ئەدۆزینەوە لە بەر ئەوە خودا رەوای دیتووە بە زانایانی دین لە شتی نادیاری بکۆڵنەوە تا مانای دەرئەکەوێ.

وە ئەو ئایەتانەی کە باسی دروست کردنی ئەرز و ئاسمان و رۆژ و مانگ و ئەستێرە و هاتوچۆ و سووڕانەوەی ئەمانە ئەکەن حەزرەتﷺ لەبەر چەند هۆیەك بۆی باس نەکردووین.

یەکەم: لەو سەردەمەدا بە سوودترینی ئیشی ئیسلام ئەوە بووە کە تەمێی ئادەمیزاد بکرێت بۆ خوداناسین و روو کردنە بیر و باوەڕی راست و رەوشتی جوان و کردەوەی پەسەند و بەجێ‌هێنانی ئەو ئادابە کە خودا بڕیاری داوە موسوڵمانان بیانکەن.

دووەم: لەبەر بەربەرەکانێ کردنی دوژمنانی ئایین مەیدان نەبووە باس لەم شتانە بکەن؛ چونکە سیازدە ساڵ پاش ئەوە کە پێغەمبەر بوو بە پێغەمبەر هەر لە شاری مەککەدا موسوڵمانان لە ژێر ئازار و ستیزەی کافرەکانا پەنهان و لە وڵات دەرچوو

بوون. وە دە ساڵی دوایی کە لە مەککەوە کۆچی کرد بۆ مەدینە هەر ئەوەندە فریا کەوتن کە دەور و بەری خۆیان لە کافر پاك بکەنەوە و ئەو ئادابانە کە پێویستی ئیسلامن نیشان بدرێن.

سێهەم: ئادەمیزادی ئەو رۆژە نەخوێندەوار و بێ‌ئاگا بوون لە کارەساتی عیلمی و فەننی و تێگەشتن لەم زانستە دژوارانە پێویستی بە خوێندنی گەلێ ئەوزاعی کیمیایی و فیزیایی و هەندەسە و حیسابات و ئەحواڵی مادەی موجوودات هەیە.

چوارەم: زانستی ئەمانە شتێ نییە کە لە پێش هەموو شتێکا پێویستی ژیانی ئادەمیزاد بێ، بەڵکوو ئەمانە ئەوزاعێکن کە لەگەڵ بەرزەوەبوون و گۆڕانی چەرخی خوێندەواری ئادەمیزادا دەرئەکەون و دەرکەوتووە کە لە پاشەڕۆژا ئادەمیزاد بە قەد تەوانای خۆی هەوڵ ئەدا و ئەیانزانێ.

کەوابێ پێویستی ئادەمیزادی ژیر ئەوەیە هەوڵ بدا بخوێنێ و بە گوێرەی رۆژ و چەرخ دەرگای زانست لە خۆی بکاتەوە؛ چونکی ئایینی ئیسلام وەکوو هەموو ئایینێکی راست رێگەی داوە ئادەمیزاد لە بارەی زانستەوە خۆی پێ بگەیەنێ.

﴿ذلك الكتاب﴾: ئیشارەتە بەو کتێبە بەرزە کە خودای تەعالا بە تەوانایی خۆی لە «لوح المحفوظ»دا نووسیویەتی و بە چەن جار لە ماوەی (٢٣) ساڵا بە گوێرەی پێویست بە فریشتەی بەرزی بارەگای خۆیدا کە لە دینی ئیسلاما ناوی جوبرەئیلە ناردوویەتی بۆ لای پێغەمبەر ﷺ. وە غەیری زاتی خوا کەس پەیوەندی بەو کتێبە نەبووە نە بە دڵ و نە بە زمان و نە بە نووسین.

﴿لا ريب فيه﴾ رەیب: بە مانا دوودڵی و گومان و پەرێشان خاترییەو، مەبەست لەم وتارە ئەمەیە ئەو کەسەی بە دڵی خاوێنەوە بیر بکاتەوە لە حاڵی ئەم پێغەمبەرە کە نە خوێندەوار بووە و نە لەگەڵ خوێندەوارانیشا بووە و بیر لەم قورئانە بکاتەوە

کە وتارێکە بە مەغز و مانا و شێوەی لە شێوەی وتاری ئادەمیزاد ناچێ و باسی مێژووی پێشینان و گەلێ کارەساتی داهاتوو ئەکا و، پارچەکانی هاوڕێی راستی و ساغییە و زیادەڕەوی و دەرچوون لە هۆشی ئادەمیزادی ژیر نییە و باسی گەلێ ئەوزاعی عەرز و ئاسمان و دەریا و کەشتی و کشتوکاڵ و زەوی و بەسەرهاتی زەوی ئەکا و، بە جارێ ئادەمیزاد بۆ دڵپاکی و دڵسۆزی و بیر و باوەڕی چاك و کردەوەی پاك بانگ ئەکا و... یەکێ کەمێ بیر لە مانا بکاتەوە ئەزانێ ئەم وتارە نە وتاری موحەممەد و نە وتاری باقی ئادەمیزادە و بەس لە لایەنی پەروەردگارەوە هاتووەتە خوارەوە بۆ تەمێی ئادەمیزاد و نیشاندانی رێگەی راست.

﴿للمتقين﴾: لە «تقوىٰ» وەرگیراوە، بە مانا خۆپاراستنە. مەبەست لە تەقوا لە دینی ئیسلاما بە رووناکی سێ شتە:

**یەکەم**: خۆپاراستن لەو بیر و باوەڕە پەستە نابارانە کە ئادەمیزاد بۆ خودانەناسی و بت پەرستی و پاڵ دان بە شتی بێمایە و بێشوعوور و بێهۆشەوە رائەکێشی. یانی خۆ پاراستن لە کافرێتی بە هەموو شێوەیێ.

وە خۆپاراستنیش لەو بیر و باوەڕە کە دوورە لە شێوەی ئەوەی پێغەمبەری خودا و هاوڕێکانی لەسەری رابوردوون. بە کورتی خۆپاراستن لە «بدعة» (بیری نابار دامەزراندن).

**دووهەم**: خۆپاراستنە لەو کردەوە ناپەسەندانە و لەو تاوانبارییانە کە ئینسان ئەکا بە ئادەمیزادێکی ناڕێکی نابارى زیانکار بۆ کۆمەڵی موسوڵمانان، وەکوو خوێنڕێژی و داوێن پیسی و دەست و زمان پیسی و وێنەی ئەمانە. یانی خۆپاراستن لە تاوانباری.

**سێهەم**: خۆپاراستنە لە هەرشتێ بێسوود و بڕاوە بێ و، هەمیشە دڵی لای خودا بێ بە مەعنای کەلیمە. ئەمەیش مەعنای وا نییە کە ئیش و کاری ژیانی نەبێ و

خۆی بکا بە کێوی! بەڵکوو مەعنای وایە لەگەڵ بەجێ‌هێنانی پێویستی ژینی پیاوانە، مەرد بێ و روو لە پیرۆزیی نەبڕاوە بێ. بە کورتی یەکەم ئادەمی چەرخی خۆی بێ.

بە بەشی یەکەم ئادەمیزاد لە کافری دەردەچێ و ئەبێ بە موسوڵمان، هەروەها ئەبێ بە موسوڵمانێکی پەیڕەویکەری پێغەمبەری نازار. بە دووهەم ئەبێ بە موسوڵمانێکی راست (عادل) و راساڵ. بە سێهەم ئەبێ بە موسوڵمانێکی نایاب و ناودار. ئەمانە هەموو وان لە ناو موسوڵمانیدا، یانی ئینسانێ موسوڵمانی ساغ بێ هەموو ئەم بەشانەی هەیە. وە پایە نییە لە ئیسلامییەت بەرزتر بێ، ئەگەرچی لە ناو خەڵکا یەکێ ئەمانەی هەبێ بە وەلی (دۆستی خودا) ناو ئەبرێ. شێخ عەبدورڕەحیمی مەولەوی﷬ بۆ ئیشارەت بەم سێ بەشەی تەقوا لە تاریفی وەلی دا دەفەرموێ:

**وەلی: شەخسێکە «عاریفەن بیللاه» «ما أمکن» بە زات بە سیفات ئاگاه**

**بیکێشی بە سەنگ هەر سێ تەقوادا بە ترازووی شەرع موویێ لا نادا**

«یؤمنون» لە مەعنای «ئیمان»دا سێ را هەیە:

[رای] یەکەم: رای زانایانی حەدیس، بە بیری ئەوان ئیمان سێ شتە؛ (١) باوەڕکردن بە دڵ بەوەی کە پێغەمبەر ﷺ لە لای خوداوە وەری گرتووە و گەیاندوویە بە ئێمە. (٢) ئیقرار بە زمان و وتنی «أشهد أن لا إله إلا اللّٰه و أشهد أن محمداً رسول اللّٰه». (٣) بەجێ‌هێنانی ئەوەی کە واجباتی موسوڵمانە و لادان لەو کردەوانە کە لە ئیسلاما نارەوان.

رای دووەم: ئیمان، بریتییە لە باوەڕی دڵ و ئیقرار بە زمان بۆ ئەو کەسە تەوانای ببێ، ئەم ئیقرارە بە زمان بڵێت، وا ئەبێ چاو پۆشی لەم ئیقرارە ئەکرێ بۆ ئەو کەسانە کە ناوێرن ئەم ئیقرارە بە ئاشکرا دەربڕن.

رای سێهەم: ئیمان، تەنیا بریتییە لە باوەڕ بە دڵ، ئیتر کردەوە داخڵی ئیمان نییە و ئیقراریش پێویستە بۆ رابواردنی فەرمانی ئیسلام بە سەر موسوڵمانەکەدا. دەلیلی ئەم رایە ئەمەیە لە گەلێ ئایات و حەدیسا ناوی تاوانبار بە موسوڵمان براوە. ئەگەر کردەوە داخڵی ئیمان بوایێ ئەبوایە هەرکەسێ واجبێ تەرك بکا، یا تاوانێ بکا بە کافر ناو ببرێ. کەوابێ کردەوە روکنی ئیمان نییە. هەرچەن لەگەڵ ئیمانی کامڵدا کردەوە هەیە.

وە ئەو ئایەت و حەدیسانە کە تاوانباران بە کافر ناوئەبەن بۆ کەسانێك ئەچنەوە کە تاوان کردنەکەیان بە رەوا بزانن. یاخود مەعنایان وایە کە ئەو کردەوانە لە شێوەی کافرانە. یاخود بۆ سەرزەنش و لۆمەی تاوانباران وا بە توندی هاتوون. وەکوو ئیمامی نەوەوی لە شەرحی «موسلیم»دا فەرموویەتی و گەلێ لە زانایانی دین پەسەندیان کردووە. بەڵام لێرەدا نوختەیێ هەیە پێویستە بزانرێ ئەوەیش ئەمەیە: هەرچەن ئیمان بە باوەڕی دڵ، تەفسیر کراوە ئەم باوەڕە بە بێ تەسلیم و رام بوونی دڵ کافی نییە؛ چونکی گەلێ لە کیتابییەکان زانیویانە بە گوێرەی ئەو نیشانانەی لە کتێبی خۆیانا وەریان گرتووە کە حەزرەت ﷺ پێغەمبەری خوایە. کەچی خودا بە کافر ناویان ئەبا، لە بەر ئەوەی بەرابەر بە حەزرەت ﷺ عەناد و سەرکێشییان کردووە.

لەبەر ئەمە ئیمان بریتییە لە: تەسدیق و باوەڕی دڵ لەگەڵ رام بوونی دڵ بۆ فەرمانبەری پێغەمبەر ﷺ «إمام الحرمين» ئەم نوختەی دەربڕیوە. مەلا سەعدی تەفتازانیش لە شەرحی مەقاسیدا بەیانی کردووە. کەوابێ ئەو کەسانە کە تەنیا ناوی تەسدیقیان بردووە لە بەر ئەوەیە کە بە زۆری تەسدیقی دڵ ئەبێ بە هۆی تەسلیم و فەرمانبەرداریش بە تایبەتی کە ئیقرار بە زمانیش لەگەڵیا شەرتە.

ئیمان باوەڕە بە شەرتی تەسلیم یانی دڵڕامی بۆ خاوەن تالیم
دڵ کە سەرکێش بوو خاوەن کێش نیە کێش لەگەڵ رێشا کەم و بێش نییە

**«بالغیب»** غەیب: بریتییە لەو شتانە کە هەستیان پێ نەکرێ و بە ئاشکرا عەقڵ پێیان نەگا؛ وەکوو زاتی خودای تەعالا و، فریشتە و، هەموو ئەو شتە پەنامەکییانە کە پێغەمبەر ﷺ باسی کردوون.

بەم بەیانە غەیب، رۆژی قیامەتیش ئەگرێتەوە، بەڵام بۆیە لە ئایەتی دواییدا ناوی ئیمان بە رۆژی قیامەت براوە لەبەر زیادە ئیعتیباری باوەڕ بە پاشەڕۆژ.

لە واقیعا باوەڕ بە روژی پاشەڕۆژ ئەبێ بە هۆی تێکۆشین لە کردەوەی باشا و ئەبێ بە پارێزەری ئادەمیزاد لە کردەوەی ناڕەوا و ئەگەر حسێبی ئەو رۆژە نەبێ ئەنجامێ بۆ فەرمانی خودای تەعالا و فەرمانبەرداری نامێنێ بەڵکوو جیایی لە میانەی ئادەمیزاد و باقی گیانلەبەرانا هەڵئەگیرێ.

**بێداری:**

هۆی ئەوە کە خودای تەعالا لەم شوێنەدا باسی باوەڕکردنی بە باقی یاسای ئیسلام نەکردووە، وەکوو رۆژوو و حەج و... ئەوەیە کە لە کاتی هاتنەخوارەوەی ئەم ئایەتانەدا ئەو یاسایانە دانەمەزراون. یا لە بەر ئەوەیە کەسێ کە باوەڕ بە پێغەمبەر ﷺ بکا لە باسی بوونی خودا و فریشتە و ئایینی ئیسلاما، باوەڕ ئەکا بە هەر شتێ غەیری ئەوانەیش کە حەزرەت ﷺ بفەرموێت.

**پوختەی مەعنای ئەم ئایەتانە:**

ئەو کتێبە بەرزە خاوەن پایە و مایە کە سوود بەخشە بۆ عالەم گومان و دوو دڵیی تیا نییە بۆ ئەوانە بە هۆشی رۆشنەوە بە ئینساف لێی ئەکۆڵنەوە.

ئەو کتێبە هۆی تێگەیشتن و پێگەیشتنە بۆ ئەوانەی ئەیانەوێ خۆیان لە ئازار و ناباری ئەم چەرخە و رۆژی دوایی بپارێزن.

ئەو پارێزگارانە کە باوەڕیان بەو شتە پەنامەکییانە هەیە کە پێغەمبەر ناوی بردوون، ئەوانەی کە نوێژەکان بە ساغی بەجێ دێنن و لەو داراییە کە هەیانە بەشی خەڵکی ئەدەن، بەو یاسا کە فەرمانیان پێ دراوە.

ئەوانەی باوەڕیان هەیە بەم کتێبە هاتووەتە خوارەوە بۆ تۆ و ئەو کتێبانەیش هاتوونەتە خوارەوە بۆ پێغەمبەرانی پێش تۆ و باوەڕیان بە ڕۆژی دوایی هەیە کە ڕۆژی تۆڵە و جەزایە و کاتی زیندووبوونەوەی نوێیە.

ئەوانە کە ئەم شێوە ڕابوردوویانە هەیە ئەوانەن لەسەر پایەی شارەزایی بۆ حەق دامەزراون و پێگەیشتوون و ئەوانەن کە بە مایەی ڕزگاری نەبڕاوە گەیشتوون.

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾

ئەو کەسانە کە مانیان گرتووە لەسەر ئینکار و سەرکێشی لە پاش ئامۆژگاری زۆر.

﴿سَوَآءٌ عَلَيۡهِمۡ ءَأَنذَرۡتَهُمۡ أَمۡ لَمۡ تُنذِرۡهُمۡ﴾

یەکسانە بۆ ئەوان ـ لە بێسوودیدا ـ بیان ترسێنی بە ئازاری قیامەت، یان نەیان ترسێنی.

﴿لَا يُؤۡمِنُونَ ٦﴾

باوەڕ بەو ئایەتانە ناکەن تۆ بە سەریانا ئەخوێنیتەوە.

﴿خَتَمَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ وَعَلَىٰ سَمۡعِهِمۡۖ﴾

بەرابەر بە سەرکێشی و دڵ ڕەقی ئەوان خوای عالەم ڕقی لێ گرتوون و دڵی لە بیر و باوەڕی ڕووناك دوور خستوونەتەوە و هەستی بیستنیانی پەك خستووە لەوە پەند و ئامۆژگاری بە سوود وەربگرن. وەکوو چۆن فەرماندەری دادگا دەرگای خانووی ئادەمیزادی دەستبادی سەرسەری مۆر ئەکا و ئەی گێڕێتەوە لە دەست بردن بۆ ناو ماڵی خۆی.

